# حوکمی مەسحکردن لەسەر

# گۆرەوی (جۆراب)



ئامادەکردنی

مامۆستا سەردار جبار محي الدين

# حوكمی مەسحكردن لەسەر گۆرەوی (جۆراب)

## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله سيدنا محمد بن عبد الله وعلى آله وصحبه ومن والاه. أما بعد:

مەسحكردن لەسەر گۆرەوی بابەتێكی فقهیەو پێویستە ئەم بابەتەو سەرجەم بابەتە فیقهیەكانی تر بەشێوەیەكی زانستی ورد بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوە فقهیە ڕەسەنەكان دیراسە بكرێت نەك بەشێوەیەكی سەتحی و بەسێرچێكی گۆگڵ یان فەتوای زانایەكی سەردەم بابەتەكەدا یەكلابكرێتەوە.

سەرەتا پێویستە لەم بابەتەدا تحریری محلی نیزاع بكەین بزانین ئەوەی محلی اتفاقە چیەو ئەوەشی خیلافی تێدایە چیە:

**یەكەم:مەسحكردن لەسەر خوف ئیجماعی لەسەرە:**

قال ابن المبارك: «لَيْسَ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ اخْتِلَافُ أَنَّهُ جَائِزٌ»

«الأوسط» لابن المنذر (١/ ٤٣٤).

وقال ابن المنذر: «وأجمعوا على أن من أكمل طهارته، ثم لبس الخفين وأحدث؛ أن له أن يمسح عليهما».

«الإجماع» لابن المنذر (ص٤٤).

**دووەم: مەسحکردن لەسەر گۆرەوی تەنك كە نەتوانرێت ڕێی پێوەبكرێت درووست نیە بە ئیجماعی زانایان:**

**ئەمەش وتەی بەشێكە لە زانایانی ئومەتی ئیسلامی لە كۆن و تازەدا كە ئیجماع و ئیتیفاقی ئومەت نقڵ دەكەن لەسەر ئەم بابەتە:**

**١-قال ابن القطان الفاسي: «وأجمع الجميع أن الجوربين إذا لم يكونا كثيفين لم يجز المسح عليهما». «الإقناع في مسائل الإجماع» (١/ ٩٠).**

**٢-وقال الكاساني: «وأما المسح على الجوربين، فإن كانا مجلدين، أو منعلين، يجزيه بلا خلاف عند أصحابنا وإن لم يكونا مجلدين، ولا منعلين، فإن كانا رقيقين يشفان الماء، لا يجوز المسح عليهما بالإجماع، وإن كانا ثخينين لا يجوز عند أبي حنيفة، وعند أبي يوسف ومحمد يجوز». «بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع» (١/ ١٠).**

**٣-وقال ابن مَازَةَ البخاري الحنفي: «وأما المسح على الجوارب، فلا يخلو: إما إن كان الجوارب رقيقاً غير منعل، وفي هذا الوجه لا يجوز المسح بلا خلاف» «المحيط البرهاني» (١/ ١٦٩).**

**٤-وقال بدرالدين العيني: «وكذا على الجوارب المتخذة من الجلد التي تكسر مع الكعب وهي الجوارب الصوفية، لا يجوز حتى تكون بحيث يمكن متابعة المشي عليها...... والرقيق من غزل أو شعر بلا خلاف، ولو كان ثخيناً بحيث يمشي به فرسخاً فصاعداً كجوارب أهل بدر فعلى الخلاف».** «البناية شرح الهداية» (١/ ٦٠٨).

**٥-وقال المرداوي: «أَوْ الْجَوْرَبَ خَفِيفًا يَصِفُ الْقَدَمَ ، أَوْ يَسْقُطُ مِنْهُ إذَا مَشَى لَمْ يَجُزْ الْمَسْحُ عَلَى هَذَا بِلا نِزَاعٍ».** « الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف » (١/ ٤١١).

**٦-وقال ابن نجيم المصري: «وَفِي الْمُجْتَبَى لَا يَجُوزُ الْمَسْحُ عَلَى الْجَوْرَبِ الرَّقِيقِ مِنْ غَزْلٍ أَوْ شَعْرٍ بِلَا خِلَافٍ، وَلَوْ كَانَ ثَخِينًا يَمْشِي مَعَهُ فَرْسَخًا فَصَاعِدًا كَجَوْرَبِ أَهْلِ مَرْوَ فَعَلَى الْخِلَافِ»** «البحر الرائق شرح كنز الدقائق» (١/ ١٩٢).

**٧-وقال الشيخ محمد يوسف البنوري: «اتفق الأئمة على جواز المسح على الجوربين المجلدين والمنعلين وكذلك اتفقوا على عدم جوازه على الرقيقين يشفان».** «الأساس في السنة وفقهها - العبادات في الإسلام» (١/ ٤٠٩).

**٨-وقال الشيخ الدكتور مصطفى ديب البغا: «الذي يمسح على الجوربين العاديين لا تصح صلاته؛ إذْ إنَّ حدثه لم يرتفع، ووضوءَه لم يصح، ومن يفتي بذلك فقد خالف اتفاق الأُمَّة عبر العصور، وهو يتحمل إثم ذلك أمام الله تعالى».**(بحوث في الفقه المقارن).

**٩-وقال الشيخ عبد الحميد طهماز رحمه الله،: «قلَّ أنْ تتوفر هذه الشروط في الجوارب التي تُصنَعُ في هذا العصر، وقد كان الجورب يُتخذ من جلد يُلْبَسُ في القدم إلى الساق لا على هيئة الخُفِّ، أو يتخذ من غزل الصوف المفتول، يُلبَسُ في القدم إلى ما فوق الكعب، وقد اتفق الأئمة على عدم جواز المسح على الجوربين الرقيقين اللَّذينِ يشفَّان».** (الفقه الحنفي في ثوبه الجديد) (١/ ٩٨).

**كەواتە ئەم دووبابەتە جێگەی ئیجماعی زانایانە و خیلافی تێدا نەبووە.**

بەڵام لە جگە لەو شێوەی کە لە خاڵی دووەمدا باسکراوە سەبارەت بە مەسحکردن، زانایان ڕاجیاوازان هەیە لە سەر مەسحکردن لەسەر جۆراب بەم شێوەی خوارەوە :

یەکەم: جمهوری زانایان لە حەنەفییەکان و مالکییەکان و شافعییەکان مەسح کردن لەسەر جۆراب بە درووست دەزانن بە مەرجێ:

١-جۆرابەکە (الْمُنَعَّلُ) بێت واتە: لەبەشی ژێرەوەی جۆرابەکە (جلد-پێست) دانرابێت، وەکو نەعلی لێکرابێت تاوەکو پێوە ڕێبکات.

یان ٢-جۆرابەکە (الْمُجَلَّدُ) بێت، واتە: لەبەشی خوارەوە و سەرەوەی جۆرابەکە (جلد-پێست) دانرابێت.

دووەم: حنبەلییەکان و أبو یوسف القاضي و محمد بن حسن الشيباني لە حەنەفییەکان و بەشێك لە موحەقیقینی مەزهەبی شافعی: ئەوە بە مەرج ناگرن کە جۆرابەکە (الْمُنَعَّلُ) یاخود (الْمُجَلَّدُ) بێت، بەڵکو ئەگەر وایش نەبێت بەڵام ئەم دوومەرجەی خوارەوەی تێدابێت:

١-جۆرابەکە ئەستور بێت.

٢-بگونجێت بەو جۆرابانەوە ڕێبکرێت.

ئەوکاتە درووستە مەسح لەسەری بکرێت.

## نقڵکردنی وتەی بەشێك لە زانایان:

**ئەمە پوختەی بۆچوونی زانایانە لەسەر مەسحکردن لە سەر گۆرەویی جۆراب، ئەمەش بەشێکە لە وتەی زانایان لەسەر ئەم بابەتە:**

**١-قال الشافعي رحمه الله: «وَلا يَمْسَحُ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ إلا أَنْ يَكُونَ الْجَوْرَبَانِ مُجَلِّدِي الْقَدَمَينِ إلَى الْكَعْبَينِ حَتَّى يَقُومَا مَقَامَ الْخُفَّيْنِ».**

**الأم «٨/ ١٠٢».**

**٢-قال حرب الكرماني: «ورأيتُ أحمد -مرة أخرى- رأى في رجلي جوربًا رقيقًا قد استرخى من الساق فقال: لا يجوز عليه المسح؛ لأنه ليس يثبت على المكان». «مسائل حرب الكرماني كتاب الطهارة (ص:٣٦٤ ).**

**٣-وقال أبوبكر الرازي الجصاص:«وَاخْتُلِفَ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ، فَلَمْ يُجِزْهُ أَبُو حَنِيفَةَ وَالشَّافِعِيُّ إلَّا أَنْ يَكُونَا مُجَلَّدَيْنِ. وَحَكَى الطَّحَاوِيُّ عَنْ مَالِكٍ أَنَّهُ لَا يَمْسَحُ وَإِنْ كَانَا مُجَلَّدَيْنِ. وَحَكَى بَعْضُ أَصْحَابِ مَالِكٍ عَنْهُ أَنَّهُ لَا يَمْسَحُ إلَّا أَنْ يَكُونَا مُجَلَّدَيْنِ كَالْخُفَّيْنِ. وَقَالَ الثَّوْرِيُّ وَأَبُو يُوسُفَ وَمُحَمَّدٌ وَالْحَسَنُ بْنُ صَالِحٍ: «يَمْسَحُ إذَا كَانَا ثَخِينَيْنِ وَإِنْ لَمْ يَكُونَا مُجَلَّدَيْنِ».**

**«أحكام القرآن للجصاص» (٢/ ٤٤٠)**

٤-قال القاضي عبد الوهاب البغدادي المالكي: «ولا يجوز المسح على الجوربين غير المجلّدين، خلافًا لمن أجازه، ....، ولأنه لا يمكن متابعة المشي فيهما كما لو لف على رجليه خرقة» «المعونة على مذهب عالم المدينة» (١/ ١٣٨).

٥-وقال ابن قدامة: «وَكَذَلِكَ الْجَوْرَبُ الصَّفِيقُ الَّذِي لَا يَسْقُطُ إذَا مَشَى فِيهِ) إنَّمَا يَجُوزُ الْمَسْحُ عَلَى الْجَوْرَبِ بِالشَّرْطَيْنِ اللَّذَيْنِ ذَكَرْنَاهُمَا فِي الْخُفِّ، أَحَدُهُمَا أَنْ يَكُونَ صَفِيقًا، لَا يَبْدُو مِنْهُ شَيْءٌ مِنْ الْقَدَمِ. الثَّانِي أَنْ يُمْكِنَ مُتَابَعَةُ الْمَشْيِ فِيهِ. هَذَا ظَاهِرُ كَلَامِ الْخِرَقِيِّ. قَالَ أَحْمَدُ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ بِغَيْرِ نَعْلٍ: إذَا كَانَ يَمْشِي عَلَيْهِمَا، وَيَثْبُتَانِ فِي رِجْلَيْهِ، فَلَا بَأْسَ» «المغني لابن قدامة» (١/ ٢١٥).

٦-وقال النووي: «قد ذكرنا أن الصحيح من مذهبنا أن الجورب إن كان صفيقا يمكن متابعة المشي عليه جاز المسح عليه وإلا فلا» «المجموع شرح المهذب» (١/ ٤٩٩).

٧-وقال ابن تيمية: «وجورب الخِرَق كجورب الصوف إذا كان صفيقًا حيث يمشى في مثله عادة. وإن كان رقيقًا يتخرّق في اليومين أو الثلاثة، أو لا يثبت بنفسه، لم يمسح عليه؛ لأن مثله لا يمشى فيه عادة، ولا يحتاج إلى المسح عليه» «شرح عمدة الفقه - ابن تيمية » (١/ ٢٣٩).

## بەڵگەی زانایان:

بەڵگەش لەسەر بە مەرجگرتنی ئەم مەرجانەی کە زانایان باسیانکرد ئەم خاڵانەی خوارەوەیە:

**١-ئیجماعی زانایان:** کە لە پێشتر ئاماژەمان پێدا کە بە ئیجماع نابێت جۆرابەکە تەنك بێت یان بەجۆرێك بێت نەتوانرێت پێیوە ڕێبکرێت (واتە بوونی ئەو دوو مەرجە محلی ئیتیفاقی زانایانە).

**٢-مەسحکردن لەسەر جۆراب قیاس دەکرێتە سەر خوف:**

بۆیە ئیستدلالیشیان بە قیاس کردووە چونکە ئەو فەرموودەی دەربارەی مەسح لەسەر جۆراب هاتووە لاوازە لای زۆربەی فەرموودە ناسان. بۆیە ئەو قەیدو مەرجانەیان بۆ مەسحکردن لەسەر جۆراب داناوە تاوەکو هاوشێوەی خوف بێت.

قال المباركفوري: «وأما أحاديث المسح على الجوربين ففي صحتها كلام عند أئمة الفن كما عرفت فكيف يجوز العدول عن غسل القدمين إلى المسح على الجوربين مطلقا.

وإلى هذا أشار مسلم بقوله لا يترك ظاهر القرآن بمثل أبي قيس وهزيل انتهى.

فلأجل ذلك اشترطوا جواز المسح على الجوربين بتلك القيود ليكونا في معنى الخفين ويدخلا تحت أحاديث الخفين فرأى بعضهم أن الجوربين إذا كانا مجلدين كانا في معنى الخفين ورأى بعضهم أنهما إذا كان منعلين كانا في معناهما وعند بعضهم أنهما إذا كانا صفيقين ثخينين كانا في معناهما وإن لم يكونا مجلدين ولا منعلين والله تعالى أعلم» «تحفة الأحوذي» (١/ ٢٨٤).

**٣-ئەو جۆرابانەی کە هاوەڵان مەسحیان لەسەر کردووە ئەستور بووە، وە بەجۆرێك بووە کە ڕێیان پێوەکردووە.**

«قال أحمدُ، في مَوْضِعٍ: لا يُجْزِئُهُ المَسْحُ على الجَوْرَبِ، حتى يكونَ جَوْرَبًا صَفِيقًا، يَقُومُ قَائِمًا في رِجْلِهِ لا ينْكَسِرُ مِثْلَ الخُفَّيْنِ، إنَّما مَسَحَ القَوْمُ على الجَوْرَبَيْنِ أنَّهُ كان عندهم بِمَنْزِلَةِ الخُفِّ، يقُومُ مَقَامَ الخُفِّ في رِجْلِ الرَّجُلِ، يَذْهَبُ فِيهِ الرَّجُلُ ويَجِيءُ».

«المغني» لابن قدامة (١/ ٣٧٤).

وعلق شيخنا عبدالعزيز الراجحي على كلام الإمام أحمد بقوله:

«قلت: وهذا يدل على أن بعض الناس يتساهلون في المسح على الشُّراب-الجورب- الخفيف، وهو لا يقوم مقام الخف، ولا يمكن متابعة المشي عليه، فلا ينبغي الاستخفاف بمثل هذا»

«شرح جامع الترمذي - الراجحي» (١٠/ ١٢).

**وقال الشيخ عبد الله بن عبد الرحمن بن عبد الله بن جبرين: «قد كانت خفاف الصحابة من جلود وقد يكون فيها خروق، أما جواربهم فإنها تنسج من الصوف ومن الشعر، ويجعلون في أسفلها جلدة يمشون عليها، وقد يلبسون تحتها نعلاً، ولكن كثيراً ما يمشون على الجورب وحده، حيث يجعلون تحته رقعة تقيهم كما يقيهم النعل، فكانت جواربهم غليظة جداً، بحيث إنه لا يخرقها الماء؛ لقوتها، وأنها يمكن المشي عليها حتى في الرمضاء وفي الأرض المليئة بالحجارة، يمكن لأحدهم أن يمشي فيها؛ لقوتها ولغلظها، ولأن تحتها تلك الجلدة، فعلى هذا إذا كان الدليل الذي أبيح لنا فيه المسح على الجوارب هو قصة الصحابة، فلنقف على جواربهم لنعرف أن جواربهم غليظة ليست شفافة، أما الذين يلبسون جوارب شفافة بحيث يخرقها البصر فضلاً عن الماء، فنقول: لا يجوز المسح على مثل هذه؛ لكونها خفيفة»**. شرح عمدة الأحكام لابن جبرين (٣/ ٨).

**وقال الشيخ محمد بن محمد المختار الشنقيطي:«إن الجوارب الخفيفة الشّفافة هذه لم تكن موجودة على عهد النبي صلى الله عليه وسلم؛ إنما كانوا يلبسون الجوارب الثخينة، وكانوا يمشون**

بها، ولذلك كانوا يلفون الخرق على أقدامهم، وهو المُعبَّرُ عنه بالتساخين في بعض الروايات، وهذا يدل على ما اعتبره العلماء من اشتراط الصَّفاقَةِ أي: كونه صفيقاً»

شرح زاد المستقنع في اختصار المقنع لمحمد بن محمد المختار الشنقيطي.

## ٤-ئاثارى تابعين:

ابن أبي شيبة له پەرتوكی (المصنف) دا دەفەرموویت: «حدثنا هشيم قال: أخبرنا يونس عن الحسن، وشعبة عن قتادة عن سعيد بن المسيب والحسن أنهما قالا: يمسح على الجوربين إذا كانا صفيقين» «مصنف ابن أبي شيبة» (٢/ ٤٠٥ ت الشثري).

٥-مەرجی پێوەڕێكردن بە جۆرابەوە بۆیە دانراوە بۆ دروستی مەسح لەسەری، چونكە مەسحكردن تەشریعكراوە بۆ حاڵەتێك كە پێویست بێت ئەو خوفە یان ئەو جۆرابە لەپێبكرێت، وە ئەوەشی كە دەكرێت پێییوە ڕێبكرێت، پێویستی وادەخوازێت لەپێبكرێت، وە قورسیشە داكەندنی بۆ هەموو دەستنوێژێك، بەڵام ئەوەی كە ناكرێت پێیوە ڕێبكرێت ئەوە حاجەو پێویستییەكە نایگرێتەوە، بۆیە ڕوخسەتەكەش نایگرێتەوە.

قال ابن تيمية: «أَنَّ مَا يُلْبَسُ فِي الرِّجْلِ إِذَا كَانَ الْمَحَلُّ الْفَرْضُ يُمْشَى فِيهِ عَادَةً فَقَدْ شَارَكَ الْخُفَّ فِي الْمَعْنَى الَّذِي أُبِيحَ لَهُ الْمَسْحُ فَيُشَارِكُهُ فِيهِ سَوَاءٌ كَانَ مِمَّا يُقْطَعُ بِهِ الْمَنَازِلُ وَالْقِفَارُ أَوْ لَا، وَلِهَذَا يُمْسَحُ عَلَى الْخُفِّ مِنْ جِلْدٍ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ نَعْلٌ؛ وَذَلِكَ لِأَنَّ الْمَشْيَ فِيهِ عَادَةً هُوَ مَظِنَّةُ الْحَاجَةِ إِلَى لُبْسِهِ وَسَتْرِهِ لِمَحَلِّ الْغَرْضِ لِيَنْتَقِلَ الْغَرْضُ إِلَيْهِ، فَإِذَا حَصَلَا تَعَيَّنَ جَوَازُ الْمَسْحِ عَلَيْهِ، وَلِذَلِكَ كَانَ الْمَسْحُ عَلَى ذَلِكَ مُنْتَشِرًا فِي الصَّحَابَةِ مِنْ غَيْرِ مُخَالِفٍ، قَالَ أَحْمَدُ: « يُذْكَرُ الْمَسْحُ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ عَنْ سَبْعَةٍ أَوْ ثَمَانِيَةٍ مِنَ الصَّحَابَةِ « وَجَوْرَبُ الْخِرَقِ كَجَوْرَبِ الصُّوفِ إِذَا كَانَ صَفِيقًا حَيْثُ يُمْشَى فِي مِثْلِهِ عَادَةً، وَإِنْ كَانَ رَقِيقًا يَتَخَرَّقُ فِي الْيَوْمَيْنِ أَوِ الثَّلَاثَةِ أَوْ لَا يَثْبُتُ بِنَفْسِهِ لَمْ يُمْسَحْ عَلَيْهِ؛ لِأَنَّ فِي مِثْلِهِ لَا يُمْشَى فِيهِ عَادَةً وَلَا يُحْتَاجُ إِلَى الْمَسْحِ عَلَيْهِ». شرح العمدة لابن تيمية - كتاب الطهارة (ص: ٢٥٠)

وقال ابن رفعة من الشافعية: «قال: يمكن متابعة المشي عليه؛ لأن المسح على الخف شرع رخصة لما تدعو الحاجة إلى لبسه، وما يمكن متابعة المشي عليه، الحاجة داعية إلى لبسه، ويعسر قلعه في كل وضوء، وما لا يمكن متابعة المشي عليه، ليس في معرض عموم الحاجة؛ فلم تتناوله الرخصة؛ كاللفافة. «كفاية النبيه في شرح التنبيه» (١/ ٣٥٨).

## شوبهەیەك و وەڵامدانەوەی:

دوای ئەوەی ئەوە ڕوونبوویەوە کە زانایان یەکڕان لەسەر مەسح نەکردن لە سەر جۆرابێك کە تەنك بێت وەنەتوانرێت ڕێی پێوەبکرێت، وتەیەکی ئیمامی نەوەوی هەیە کە لە زاهیریدا وادەبینرێت کە بەشێك لە زانایان بەدرووستی دەزانن کە مەسح بکرێت لە سەر جۆراب ئەگەر تەنکیش بێت، بەڵام ئەم وتەیە چەندین سەرنجی لەسەرە ئێستا وتەکەو سەرنجەکانیش دەخەمە ڕوو:

قال النووي: «وَحَكَى أَصْحَابُنَا عَنْ عُمَرَ وَعَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا جَوَازَ الْمَسْحِ عَلَى الْجَوْرَبِ وَإِنْ كَانَ رَقِيقًا وَحَكَوْهُ عَنْ أَبِي يُوسُفَ وَمُحَمَّدٍ وَإِسْحَاقَ وَدَاوُد . وَعَنْ أَبِي حَنِيفَةَ الْمَنْعُ مُطْلَقًا وَعَنْهُ أَنَّهُ رَجَعَ إلَى الإِبَاحَةِ». «المجموع شرح المهذب» (١/ ٥٠٠).

لە ڕاستیدا ئەم گێڕانەوەیە ئیجماعی زانایان هەڵناوەشێنێتەوە لەبەر ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١-ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت زانایانمان-لە مەزهەبی شافعی- گێڕاویانەتەوە (وَحَكَى أَصْحَابُنَا) و ناوی ئەو زانایانەی مەزهەبی شافعی ناهێنێت و ئاماژەش بە سەرچاوەکان ناکات-ئەمەش

ئسلوبێکی شائیعە لە نێو کتێبی فوقەهادا- بەڵام ئێمە وەکو بەڵگە ناتوانین نەقڵی بکەین و استدلالی پێوەبکەین تاوەکو نەگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە سەرەکییەکانی ئەو گێڕانەوەیە.

٢-لە بەحسی علمیدا گەر بتەوێت استدلال بە أحادیث یان ئاثاری هاوەڵان بکەیت ناتوانیت لە کتێبی فوقەهائەوە وەریبگریت و لەکتێبە فقهیەکانەوە تخریجی بکەیت، بەڵکو دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ ئەو سەرچاوە سەرەکیانەی کە مەظانی ئاثاری صەحابەو تابعینن و بەسەنەد ریوایەتیان کردووە، وەکو مصنفی عبدالرزاق و ابن أبی شیبە والسنن الکبری و معرفة السنن والآثار ی ئیمامی البیهقی و جگە لەوانەش...

بە گەڕانەوەیش بۆ ئەو سەرچاوانە دەبینین روایەت کراوە لە ئیمامی عمر و علی کە مەسحیان لەسەر جۆراب کردووە بەڵام لە هیچ سەرچاوەیەکدا نە بەسەنەدی زەعیف نە بەسەنەدی سەحیح باسی جورابی رقیق-تەنك نەکراوە وەکو ئەوەی لە گێڕانەوەکەی مەجموعدا هاتووە . . .

**ئەمەش بەشێك لە ریوایەتەكان:**

**عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنِ الزِّبْرِقَانِ، عَنْ كَعْبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: رَأَيْتُ عَلِيًّا بَالَ، فَمَسَحَ عَلَى جَوْرَبَيْهِ وَنَعْلَيْهِ، ثُمَّ قَامَ يُصلِّي»**

أخرجه عبدالرزاق فی المصنف برقم (٨٠٢) «مصنف عبد الرزاق» (١/ ٤٥٨).

**«عن وكيع عن أبي جناب عن أبيه عن جلاس بن عمرو: أن عمر توضأ يوم جمعة، ومسح على جوربيه ونعليه»** أخرجه ابن أبی شییبه فی المصنف برقم(١٩٩٢)، وضعفه شيخنا سعد الشثري «مصنف ابن أبي شيبة» (٢/ ٤٠٥ ت الشثري).

**«أبو بكر بن عياش عن عبد الله بن سعيد عن (جده) قال: رأيت عليا بال، ثم مسح على جوربيه ونعليه»** أخرجه ابن أبی شیبه برقم(١٩٩٨) وضعفه شيخنا سعد الشثري«مصنف ابن أبي شيبة» (٢/ ٤٠٦ ت الشثري).

**«وكيع قال: حدثنا يزيد بن مردانبه عن الوليد بن سريع عن عمرو بن حريث أن عليا توضأ، ومسح على الجوربين»** أخرجه ابن أببي شيبة وحسنه شيخنا سعد الشثري. «مصنف ابن أبي شيبة» (٢/ ٤٠٧ ت الشثري).

عن أَبِي عَبْدِ اللهِ الْحَافِظُ قال: أَخْبَرَنِي أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ بَالُوَيْهِ، ثنا مُحَمَّدُ بْنُ غَالِبٍ، ثنا عُبَيْدُ اللهِ بْنُ مُعَاذٍ، ثنا أَبِي، ثنا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي الْوَرْقَاءِ، سَمِعَ رَجُلًا مِنْ قَوْمِهِ يُقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ كَعْبٍ يَقُولُ: « رَأَيْتُ عَلِيًّا بَالَ، ثُمَّ مَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ ».أخرجه النسائي في السنن الكبرى. السنن الكبرى للبيهقي (١/ ٤٢٧).

عن محمد بن عبد الوهاب قال: ثنا جعفر بن عون، ثنا يزيد بن مردانبة، ثنا الوليد بن سريع، عن عمرو بن حريث، قال: رأيت عليا بال، ثم توضأ، ومسح على الجوربين.أخرجه ابن المنذر في الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف برقم(٤٧٩).

لەم ئەسەرانەدا بەهیچ شێوەیەك باسی جۆرابی رەقیق نەكراوە، وە دوای گەڕانێكی زۆر لە نێو سەرچاوەكاندا هیچ ئەسەرێكم نەبینی لە عومەری كوڕی خەتاب و عەلی كوڕی أبو تالبەوە یان لە هیچ هاوەڵێكی ترەوە، تەنانەت لە تابعینیش، كە مەسحیان لەسەر جوربی رقیق كردبێت.

بەڵكو بە پێچەوانەوە ئەسەرێك هاتووە لە مصنفی ابن أبی شیبە لە دوو گەورە تابعینەوە كە فەرموویانە: مەسح دەكرێت لەسەر هەردوو جۆراب ئەگەر ئەستور بێت.

«عن هشيم قال: أخبرنا يونس عن الحسن، وشعبة عن قتادة عن سعيد بن المسيب والحسن أنهما قالا: يمسح على الجوربين إذا كانا صفيقين» «مصنف ابن أبي شيبة» (٢/ ٤٠٥ ت الشثري).

لێرەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ناکرێت ئیستدلال بکرێت بەو گێڕانەوەکەی مەجموع دەربارەی فعلی عمر و علی ڕەزای خوای گەورەیان لێبێت، چونکە گێڕانەوەکە لە زیادکردنی وشەی (رقیق-تەنك) دەقیق و دروست نیە .

٣-لە بەحسی عیلمیدا بۆ زانینی قەولی گەورە زانایانی هەر مەزهەبێت دەبێت بگەڕێینەوە بۆ پەرتوکە معتەمەدەکانی ئەو مەزهەبە، وە لە پەرتوکی مەزهەبی ترەوە وەرناگیرێت، بۆنمونە ناتوانیت لە بەحسی علمیدا قەولی شافعیەکان لە پەرتوکی حەنەفیەکانەوە نقڵ بکرێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی جاری واهەیە خاوەن مەزهەبەکان دەقیق نین لە نقڵی قەولی مەزاهیبی تر و زانایانی مەزهەبێکی دیاری کراو ئەدراترن بە قەولی ئیامەکانیان، وەکو ئەمە بابەتەی کە باسی دەکەین کە ئیمامی نەوەوی مەسحکردن لە سەر جۆرابی رقیق دەداتە پاڵ أبو یوسف القاضي و

محمد بن حسن الشيباني ڕەحمەتی خودا لە هەردووکیان بێت.
دیارە ئارائی فقهی ئەو دوو زانایە تحریر و ضبط کراوە لە کتێبە فقهیەکانی حەنەفیەکان وە دەبێت لەوێشەوە وەریانبگرین.
بە گەڕانەوە بۆ پەرتوکی حەنەفیەکان دەبینین ئەو دوو ئیمامە بە هیچ شێوەیەك وایان نەوتووە و بەڵکو هاوڕای حەنبەلیەکانن کە ئەستوری جۆراب و گونجانی پێوە ڕێکردنیان بەمەرج زانیوە، جیاوازیان لە گەڵ ئیمامی أبو حنیفەش ئەوەیە کە ئەمان ئەوە بەمەرج نازانن کە جۆرابەکە المنعل یان المجلد بێت.

ئەمەش بۆچوونی ئەو دوو زانایە لە پەرتوکی حەنەفیەکان:
ئیمامي طەحاوی دەفەرموێت: أنا لا نرى بأسا بالمسح على الجوربين , إذا كانا صفيقين قد قال ذلك أبو يوسف , ومحمد. وأما أبو حنيفة رحمه الله تعالى , فإنه كان لا يرى ذلك حتى يكونا صفيقين , ويكونا مجلدين , فيكونان كالخفين. شرح معاني الآثار (١/ ٩٨).
وە ئیمامی الکسائی فەرموویەتی: - وَأَمَّا الْمَسْحُ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ ، فَإِنْ كَانَا مُجَلَّدَيْنِ ، أَوْ مُنَعَّلَيْنِ ، يُجْزِيهِ بِلا خِلافٍ عِنْدَ أَصْحَابِنَا وَإِنْ لَمْ يَكُونَا مُجَلَّدَيْنِ ، وَلا مُنَعَّلَيْنِ ، فَإِنْ كَانَا رَقِيقَيْنِ يَشِفَّانِ الْمَاءَ ،

لا يَجُوزُ الْمَسْحُ عَلَيْهِمَا بِالإِجْمَاعِ ، وَإِنْ كَانَا ثَخِينَيْنِ لا يَجُوزُ عِنْدَ أَبِي حَنِيفَةَ وَعِنْدَ أَبِي يُوسُفَ ، وَمُحَمَّدٍ يَجُوزُ .بدائع الصنائع (ج١ ص١٠).

ئەم دوو نەقڵەش وەکو نمونە بۆئەوەی درێژنەبێتەوە ئەگینە قولی ئەو دوو زانایە لەم بابەتەدا لە زۆربەی کتێبی حەنەفیەکاندا باسکراوە بەوجۆری کەباسمانکردن.

سەبارەت بە ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهیش:

ئیمامی الکرمانی لە کتابی (مسائل حرب الكرماني للإمامين: أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهويه) دەفەرموێت:

«سألت إسحاق: رجل في إحدى رجليه خف، وفي الأخرى جورب، أيمسح عليهما؟ قال: نعم، إذا كان الجورب من صوف أو مِرْعِزَّى، قلت: فإن كان الجورب من خرقة؟ قال: لا يمسح عليه» «مسائل حرب الكرماني كتاب الطهارة» (ص٣٩٥).

لەو گێڕانەوەی ئیمامی الکرمانی ئەوە دەردەکەوێت کە ئیمامی اسحاقی راهەویە مەسحی لەسەر جۆراب بەدرووست زانیوە ئەگەر لە خوری یان مرعزی (کە بەکوردی پێی دەڵێن: مەرەز: کە مویەکی نەرمە بە ئەندامی جۆرە بزنێکەوەیە) . . .

بەڵام مەسحی لەسەر جۆرابێك كە لە خرقە پەڕۆ درووست كرابێت بە درووست نەزانیوە، وە  بە هیچ جۆرێك باسی جۆرابی رقیق و تەنكی نەكردووە وەكو ئەوەی كە لە مەجموعدا گێڕدراوەتەوە.

كەواتە گێڕانەوەكەی مەجموع بۆ اسحاقی راهەوەیهیش دەقیق نیە.

سەبارەت بە داود الظاهري بە دوای گەڕانێكی زۆر وهیچ وتەیەكیم نەبینی لەسەر مەسحكردن لەسەر جۆراب و جۆرابی تەنك.

٤-ئیمامی نەوەوی كە ئەو گێڕانەوەی لە مەجموعدا هێناوە، لە دوای چەند دێڕێك بە بۆ چوونێكی لاوازی دەزانێت و بە سێ خاڵ ڕەدی دەداتەوە، وە ئەگەر ئیمامی نەوەوی ئەو دوو ئەثەرەی ئیمامی عومەر و عەلی بەو جۆرەی كە لە مەجموعدا دایناوە بە سەحیح بزانێت، بێگومان بەو جۆرە ڕەتی ناكاتەوە و  بە بۆچونێكی لاواز لە قەڵەمی نادات.

**٥-زانای تری مەزهەبی شافعی حیکایەی ئەو ئەثەرانە و قەولی أبو یوسفی القاضي و محمد بن حسن الشیبانی و داودی الظاهري یان کردووە بەبێ ناوهێنانی رەقیق بەڵکو فەرموویانە صفیق و ئەستوور، لەو زانایانە خاوەنی پەرتوکی (البیان فی مذهب الإمام الشافعي) کە ئیمامی أبو الحسین العمرانی الیمنی یە، کە دەفەرموێت:«وقال أحمد: يجوز المسح على الجورب الصفيق ، وإن لم يكن له نعل. وروي ذلك عن عمر، وعلي، وإليه ذهب أبو يوسف، ومحمد، وداود».**

**وە هەروەها ئیمامی الرویانی دەفەرموێت: «فإن تقرر هذا ينظر في الجوربين، فإن كان رقيقين غير مجلدين ولا منعلين لم يجز المسح عليهما، وقال أحمد وإسحاق: يجوز المسح إذا كان صفيقًا، وبه قال عمر، وعلي رضي الله عنهما وهو مذهب أبي يوسف، ومحمد، وداود»** «بحر المذهب للروياني» (١/ ٢٩٠).

**بۆیە لە هەموو ئەو خاڵانەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەوگێڕانەوەیە دەقیق نیە و ئەمەش نابێتە طەعن لە مەجموع چونکە هیچ کتێبێك نیە جگە لە قورئان و سونەت ئیلا دەکرێت لە چەند شتێکدا سەرنج هەڵبگرێت و نوسەرەکەی تێیدا نەیپێکابێت.**

## وتەی زانایانی سەردەم:

وە بە گەڕانەوە بۆ پەرتوکی هەموو فوقەهاکانی ئیسلام لە مەزاهیبە جیاوازەکان و شار و وڵاتە جیاوازەکان دەبینین وتەکانیان هەمووی لای نەداوە لەو ئیجماعە و هەموویان جەختیانکردوەتەوە لەو مەرجانەی کە باسمانکرد، ئەمەش بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە بۆ ڕاستی ئەو ئیجماعە، وە بێگومان خوای گەورە ئومەتی موحەمەد صلی الله علیه وسلم لەسەر باتڵ کۆناکاتەوە.

بەڵام تەقریبەن لە دوای ساڵی (١٣٠٠) هیجری بەدواوە چەند زانایەکی کەم هەبوونە کە پێیان وابووە کە مەسح لەسەر جۆرابی ڕەقیق تەنکیش دەکرێت، لەوانە (محمد جمال الدین القاسمی و الألبانی وابن عثیمین..) ڕەحمەتی خودا لە هەموویان بێت، بێگومان ئەمانە زانای گەورە بوونە و نەپێکانیان لە بابەتێك یان زیاتر لە پێگەیان کەم ناکاتەوە، بەڵام ئەمەش بەو واتا نایە کە فەتوای ئەمان ئیجماعی زانایانی پێهەڵبوەشێتەوە، یان وتەی ئەمان درووستر بێت لە وتەی هەموو فوقەهای ئومەتی ئیسلام.

**زۆرینەی زانایانی سەردەمیش لەسەر ئیجماعی زانایان ڕۆشتون و جەختیان لێکردوەتەوە لەو زانایانە:**

**١-الشيخ محمد بن ابراهيم آل الشيخ فەرموویەتی: «إذا كان صفيقا لا يصف البشرة يثبت بنفسه، ساترا للمفروض جاز المسح عليه».**

**وقال: «يجوز المسح على الشراب ونحوها سواء كانت من صوف أو من وبر أو من شعر أو من قطن أو غيرها -وتسمى الجوربين- إذا كانت صفيقة ساترة لمحل الفرض واستكملت الشروط المطلوبة»**

«مجلة البحوث الإسلامية» (٦٣/ ٣٩).

**٢--الشيخ عبدالعزيز بن عبدالله بن باز. فەرموویەتی: «ومن شروط المسح على الخفين: أولا: أن يلبسهما على طهارة. ثانيا: لا بد أن يكونا ساترين؛ الخفان أو الجوربان لا بد أن يكونا ساترين صفيقين».** فتاوى نور على الدرب لابن باز بعناية الشويعر (٥/ ١٥٧)

**٣-الشيخ عبد الله بن عبد الرحمن بن عبد الله بن جبرين. پێشتر وتەکەی دانرا لە بەشی بەڵگەکان، دوای چەند قەولی زانایەك قەولێکی تری دەنوسین.**

**٤-الشيخ عبدالعزيز بن عبدالله الراجحی، فەرموویەتی: «بعض الناس يتساهلون في المسح على الشُّراب-الجورب- الخفيف، وهو لا يقوم مقام الخف، ولا يمكن متابعة المشي عليه، فلا ينبغي الاستخفاف بمثل هذا»** «شرح جامع الترمذي - الراجحي» (١٠/ ١٢).

**٥- الشيخ محمد بن محمد المختار الشنقيطي، فەرموویەتی:«فإن الجورب الذي يجوز المسح عليه يشترط فيه أن يكون صفيقاً، وعلى ذلك كلمة أكثر مَنْ يَرى المسح على الجوربين، أنه لا بد أن يكون صفيقاً، وهي عبارات العلماء، لأن الجوارب الخفيفة الشّفافة هذه لم تكن موجودة على عهد النبي صلى الله عليه وسلم؛ إنما كانوا يلبسون الجوارب الثخينة، وكانوا يمشون بها»** (شرح زاد المستقنع في اختصار المقنع).

**٦-الشيخ الدكتور وهبة بن مصطفى الزحيلي لە پەرتوکەکەی (الفقه الإسلامي وأدلته) فەرموویەتی: «وأباح الحنابلة المسح على الجورب بالشرطين المذكورين في الخف وهما:**
**الأول ـ أن يكون صفيقاً لا يبدو منه شيء من القدم.**

الثاني ـ أن يمكن متابعة المشي فيه، وأن يثبت بنفسه..... والراجح رأي الحنابلة لاستناده لفعل الصحابة والتابعين، ولما ثبت عن النبي صلّى الله عليه وسلم في حديث المغيرة. وهو الرأي المفتى به عند الحنفية». الفقه الإسلامي وأدلته للزحيلي (١/ ٤٩٩).

٧- اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء. له یه‌كێك له فه‌تواكانیاندا هاتووه: «یجوز المسح علی كل ما یستر الرجلین مما یلبس علیهما من الخفاف والجوارب الصفیقة».

فتاوى اللجنة الدائمة - ٢ (٤/ ١٠١).

تەنانەت بەشێك لە زانایان خەڵكیان ئاگادارکردوەتەوە لە مەترسی تەساهولكردن لە مەسحكردن لەسەر گۆرەوییەكانی ئەم سەردەمە، وە فەرموویانە زۆربەی ئەم گۆرەوییانە مەرجە شەرعییەكانی تێدا نیە:

لەو زانا بەڕێزانەی كە خەڵكیان ئاگادار كردووەتەوە ئەمانەن:

١- الشيخ عبد الله بن عبد الرحمن بن عبد الله بن جبرين، فەرموویەتی: «وحيث إن الخلاف في المسح على الجوارب قوي، حيث منعه أكثرهم، واشترط بعضهم أن يكون مجلداً، أي في أسفله جلدة من أدم مربوطة فيه لا تفارقه، وكذا اشترط الباقون أن

يكون صفيقاً يمكن المشي فيه بلا نعل أو جزمة، وأن يكون صفيقاً لا يخرقه الماء، فإن هذا كله مما يؤكد على من لبسه الاحتياط وعدم التساهل، فقد ظهرت جوارب منسوجة من صوف أو قطن أو كتان، وكثر استعمالها، ولبسها الكثيرون بلا شروط، رغم أنها يخرقها الماء، وأنها تمثل حجم الرجل والأصابع، وليست منعلة، ولا يمكن المشي فيها، بل لا يواصل فيها المشي الطويل إلا بنعل منفصلة أو بكنادر أو جزمة فوقها، وهكذا تساهلوا في لبس جوارب شفافة قد تصف البشرة، ويمكن تمييز الأصابع والأظافر من ورائها، ولا شك أن هذا الفعل تفريط في الطهارة، يبطلها عند كثير من العلماء، حتى من أجازوا المسح على الجوارب، حيث اشترطوا صفاقتها وغلظها، واشترط أكثرهم أن تكون مجلدة أو يمكن المشي فيها».

«فتاوى الشيخ ابن جبرين» (١/ ١٤).

٢-الشيخ عبدالعزيز بن عبدالله الراجحى، فەرموویەتی:«بعض الناس يتساهلون في المسح على الشُّراب-الجورب- الخفيف، وهو لا يقوم مقام الخف، ولا يمكن متابعة المشي عليه، فلا ينبغي الاستخفاف بمثل هذا»«شرح جامع الترمذي - الراجحي» (١٠/ ١٢).

**٣-الشيخ الدكتور مصطفى ديب البغا له پەرتوكی (بحوث في الفقه المقارن) دوای ئەوەی وتەی زانایان باس دەكەكات دەفەرموێت:**

**«إنك ترى أنَّ الجميع أجازوا المسح على الجوربين، وأقوالهم كلها تدل على أن الجوارب المعروفة اليوم لا تنطبق عليها صفات الجوارب التي يصحُّ المسح عليها، ولذا: لا دليل، ولا حجة، ولا معتمد لمن يجيز المسح عليها إلا التَّمسك بالاسم، وهذا ليس بمستند لحكم شرعي، إذن فالذي يمسح على الجوربين العاديين لا تصح صلاته؛ إذْ إنَّ حدثه لم يرتفع، ووضوءَه لم يصح، ومن يفتي بذلك فقد خالف اتفاق الأُمَّة عبر العصور، وهو يتحمل إثم ذلك أمام الله تعالى».**

**٤- الشيخ عبد الحميد طهماز رحمه الله، فەرموویەتی:«قلَّ أنْ تتوفر هذه الشروط في الجوارب التي تُصنَعُ في هذا العصر، وقد كان الجورب يُتخذ من جلد يُلْبَسُ في القدم إلى الساق لا على هيئة الخُفِّ، أو يتخذ من غزل الصوف المفتول، يُلبَسُ في القدم إلى ما فوق الكعب، وقد اتفق الأئمة على عدم جواز المسح على الجوربين الرقيقين اللَّذينِ يشفَّان».** (الفقه الحنفي في ثوبه الجديد) (١/ ٩٨).

**بەڕاستی وتەی زانایان لە كۆن و تازەدا ئێجگار زۆرە لەسەر ئەم**

بابەتە، ئەوەی من لێرە دام ناوە مشتێکە لە خەرمانێك، لەبەر زۆر درێژنەبوونەوەی بابەتەکە بەوەندە ئیکتیفا دەکەم.

هەموو ئەو وتەو بەڵگانە بەسن بۆکەسێکی حەق ویست کە بەدوای حەقدا بگەڕێت، وە کە حەقی بینی شوێنی بکەوێت.

بەڕێزان ناکرێت پەلەبکرێت لە حوکمدان لەسەر بابەتە فقهیەکان، وە ناکرێت هەموو کەسێك لەم بابەتە فقهیینەدا قسەبکات، وە ناکرێت هەر حوکمێکت بینی ڕاستەوخۆ لەبەر وتەی زانایەکی ئەم سەردەمە ڕەتیبکەیتەوە و بەهەڵە لە قەڵەمی بدەیت.

ناکرێت زۆر بەئاسانی بەبێ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی ورد ئیجماعی زانایان لەبەر وتەی زانایەکی سەردەم وەلا نێیت، وە ڕاستەوخۆ بەبێ دیراسەکردن بڵێیت کێ دەڵێت ئەم ئیجماعە جێگیرو سابتە! سبحان الله ڕەتکردنەوەی ئیجماع و ئیتفاقی زانایان لەلای بەشێك لە خەڵکی زۆر ئاسانە، بەڵام فەتوای زانایەکی سەردەم هێڵی سورە.

یان کاتێك باسی مەزهەبی زانایان و وتەی زانایان دەکەیت، لەلای هەندێك دەڵێیت باسی تەورات و ئینجیل دەکەیت، دەڵێت وازبهێنە لە مەزاهیب ئێمە لە کیتاب و سونەوە دین وەردەگرین!؟

نازانێت فقهی مەزاهیب خۆی بۆخۆی لەکتاب و سونەوە وەرگیراوە و پەرتوکەکانی گەورە زانایانی مەزهەبە ئیسلامییەکان سەدان و هەزاران ئایەت و حەدیسی تێدایە.

ئەسڵەن ئیمامە گەورەکانی مەزهەب لە هەمان کاتدا فەرموودەناس و شەرعزان و فەقیە بوونە، ئیمامی مالك و شافعی و احمدیش فەرموودەناس بوونە.

دەزانن ئیمامی شافعی تەنها لە کتابی الأم: ٨٠٥ جار بەڵگەی ئایەت دەهێنێتەوە، وە ١٣٣٩ جار فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم بە بەڵگە دەهێنێتەوە، وە ١٠٠١ جار ئاثاری صەحابە دەهێنێتەوە. باشە ئەگەر کتابی الأم فقهی دەلیل نەبێت دەبێت چی کتابێك فقهی دەلیل بێت!!!

مەعقولە ئیمامێکی وەکو ئیمامی شافعی کە ئیمام بووە لە عەقیدە و لە فقە و ئسوڵی فقە و فەرموودە و لوغەی عەرەبی......

رەتکردنەوەی قەولی ئەم ئیمامە زۆر ئاسانتربێت لە قەولی زانایەکی ئەم سەردەمە!!

دەزانن ئیمامی ابوحنیفە گەشتوە بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوداو

تەنها ئەوەیە کە پێغەمبەری خودای نەبینیوە!
دەزانن نێوانی هاوەڵان و ئیمامی مالك تەهنها تابعینە و یەکێکە لە تابعی تابعین!!!
ئەم زانایانە ئەوەندە نزیك بوونە لە عهدی نبوە، وە شەرفمەند بوونە بە وەرگرتنی زانست ڕاستەوخۆ لە تابعین و ئەوانیش لە صەحابە و ئەوانیش لە پێغەمبەری خودا صلی الله علیە وسلم، وە ئەم ئیمامە گەورانە هەموو مەرجەکانی ئیجتهاد و ئیمامەتیان تێدابووە.
لە ڕاستیدا ئەم بابەتە زۆر هەڵدەگرێت، بەڵکو لە شوێنێکی تر بەتاییەت ئەم بابەتە ڕوونبکەمە، بەڵام تەنها مەبەستم ئەوەیە بابە حورمەتەوە ناوی ئەو زانایانە بهێنین و ئەوەندە جەریئ نەبێن بەرامبەریان و بزانین چۆن مامەڵەیان لە گەڵدا دەکەین.

وە لە کۆتاییدا خودای گەورە ڕەقیبە بەسەرمەوە من لەباسکردنی

ئەم باسە تەنها مەبەستم ڕوونکردنەوەی حەق و ڕاستیە و

مەبەستم لەکەدارکردن و بەرپەرچدانەوەی هیچ کەسێك نیە، بەو

هیوایەی موسوڵمانانیش سنگیان فراوان بێت و ئەم بابەتە وەکو

لێکۆڵینەوەیەکی زانستی وەربگرن، وە هەر تێبینیەکیشیان هەبێت

ئەوە بفەرموون بەشێوەیەکی زانستی ورد بینوسن بەبێ تەشەنوج

و تنطع و تەهەجوم و تشفي وتعالي و ترفع و تغلب.

وە وەرگرتنی حەق و گەڕانەوە لە شتێك کە پێشتر زانستت پێی

نەبێت واجبە و گەورەییە و مرۆڤی پێ ڕێزدار دەبێت لەلای خوداو

خەڵکی تێگەیشتویش.

والله من وراء القصد.

سردار جبار محى الدين

٢٠٢٤-١-١٤